# ( ١٤ )

# هەڵەی ڕۆژووەوان

## لە مانگی پیرۆزی ڕەمەزان

=======================================




 **ماڵپەڕی بەهەشت و وەڵامەکان** 

ba8.org

walamakan.com

هەمیشە لەگەڵمان بن بۆ بەرهەمی نوێ

بسم الرحمن الرحيم

بەتەئكید هەندێ لەڕۆژووەوانان توشی هەندێ هەڵە دەبن ڕەنگە ببێتە هۆی کەمبوونەوەی پاداشتەکەیان ، وکاریگەری دەبێت لەسەر تەواوی ڕۆژووەکانیان ، یاخود کارێك دەکەن پێچەوانەی مەبەستی ڕۆژووە و ڕێز وفەزڵی ڕۆژووەکانیان کەم دەبێتەوە ، جا هەندێ لەو سەرپێچیانە :

**یەکەم : فێر نەبوونی ئەحکامەکانی ڕۆژوو و نوێژی تەراویح** ، بۆیە دەکەوێتە هەندێ هەڵەوە بەهۆی نەزانین و نەشارەزاییانەوە ، جا بۆیە پێویستە موسوڵمان هەوڵ بدات شارەزا بێت لەدینەکەیدا " هەر بۆیەشە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو : **((من يرد الله به خيراً يفقهه في الدين))**[1].

واتە : گەر خودا خێر وچاکەی بەهەر کەسێك بوێت شارەزای دەکات لەدین .

بۆیە پێویستە لەسەر موسوڵمان پێش ئەوەی هەر عیبادەتێك ئەنجام بدات زانیاری تەواوی هەبێت لەبارەیەوە وبەنەزانی عیبادەت نەکات ، وحەتمەن یەکێك لەعیبادەتەکان ڕۆژووە ، بۆیە پێویستە موسوڵمان هەوڵ بدات ئەحکامەکانی ڕۆژوو ، وشەرت ، وپایەکانی فێر ببێت ، وەهەروەها فێر ببێت وبزانێت ڕۆژوو بەچی بەتاڵ دەبێتەوە وچ شتێك ڕێگەی پێدراوە لەڕۆژوودا وئەو کار وئادابانە

---

[1] متفق عليه: البخاري، كتاب العلم، باب من يرد الله به خيراً يفقهه في الدين، برقم ٧١، ومسلم، كتاب الزكاة، باب النهي في المسألة، برقم ١٠٣٧.

چین کەباشن ڕۆژووەوان ئەنجامیان بدات؟ تاوەکو خودا پەرستیەکەی وعیبادەتەکەی بەبەرچاو ڕوونی یەوە بکات .

**دووەم : وەك پێویست شەرم نەکردن لەخودا** ، عبد الله ی کوڕی مەسعود دەڵێت : پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی : **((استحيوا من الله حق الحياء)) قال: قلنا: يا رسول الله إنا نستحي والحمد لله، قال: ((ليس ذاك، ولكن الاستحياء من الله حق الحياء: أن تحفظ الرأس وما وعى، والبطن وما حوى، وتذكر الموت والبِلى، ومن أراد الآخرة ترك زينة الدنيا، فمن فعل ذلك فقد استحيا من الله حق الحياء))** [(١)].

واتە : (شەرم بکەن لەخودا بەشێوەیەك کە شیاوی خودا بێت) دەڵێت : گوتمان : ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سوپاس بۆ خودا ئێمە شەرم دەکەین لەخودا ، فەرمووی ( بەو شێوەیە نی یە کەئێوە لێی حاڵی بوون ، بەڕاستی شەرم کردن لەخودا بەم شێوەیە دەبێت :

سەر بپارێزت وئەوەی لەخۆی گرتووە ، وسك بپرێزرت وئەوەش لەنێو سکدایە ، وبیر لەمردن وڕزان بکرێتەوە ، وەهەرکەسێك دوا ڕۆژی بوێت واز لەخۆشی وجوانیەکانی دونیا دێنێت ، وەبەتەئکید هەر کەسێك ئەم کارە بکات ئەوا شەرمی کردووە لەخودا .

---

(١) الترمذي، كتاب صفة القيامة، بابٌ: حدثنا يحيى بن موسى، برقم ٢٤٥٨، وحسنه الألباني في صحيح سنن الترمذي، ٢/ ٥٩٠.

بێگومان ئەم فەرموودەیە ڕوونی کردۆتەوە کە شەرم کردن لەخودا وەك پێویست بەوە دەبێت کە هەموو ئەندامەکانی لاشە بپارێزرێت لەو شانەی کەخودا خۆشی ناوێن .

جا مەبەست لە : ((**أن تحفظ الرأس**)) واتە : سەر بپارێزرێت لەگوێڕایەڵی کردن بۆ جگە لەخودا ، بەوەی کە سەژدە بۆ غەیری خودا نەبات ، ونوێژ بۆ غەیری خودا نەکات ، وملکەچ نەبوون بۆ غەیری خودا ، وسەری بەرز نەکاتەوە بەتەکەبورو خۆ بەزل زانییەوە .

وەمەبەست لە: ((**وما وعى** )) واتە : پاراستنی ئەوەی کەسەر لێی پێك هاتووە ، وەك : زمان ، وچاوەکان ، وگوێیەکان ، وهەموو ئەندامەکانی لەبێفەرمانی خودا بەکار نەهێندرێت .

١- پاراستنی زمان : بەوە دەبێت کە غەیبتی هیچ کەسێکی پێ نەکات ، ودوو زمانی نەکات ، ودرۆ نەکات ، وبوختان نەکات ، وشایەتی درۆ نەدات ، وە قسەی پڕ وپووچ نەکات ، هەر بۆیە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەیفەرموو ((**من يضمن لي ما بين لَحييه وما بين رجليه أضمن له الجنة**))[1]، واتە : هەر کەسێك زەمانەتی زمانم وداوێنیم بۆ بکات ئەوا من زەمانەتی بەهەشتی بۆ دەکەم .

وەکاتێ پرسیارێ لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کرا لەبارەی ئەو کردەوە کە زۆرتر مرۆڤ بەهۆیەوە دەچێتە بەهەشتەوە ؟

---

(١) البخاري، كتاب الرقاق، باب حفظ اللسان، برقم ٦٤٧٤.

فەرمووی : ((تقوى الله وحسن الخلق)) .

واتە : تەقوای خودا وڕەوشت جوانی .

وەهەروەها کاتێ پرسیاری لێ کرا لەبارەی ئەو کردەوەوە کە زۆرتر مرۆڤ بەهۆیەوە دەچێتە دۆزەخەوە ؟

فەرمووی : ((الفم والفرج)) [١] واتە : زمان وداوێن .

٢- پاراستنی چاو : بەشێوەیەك چاوی بپارێزێت لەو شتانەی کەخودا حەرامی کردووە ونەزەری حەرام نەکات ، خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٣٠﴾ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ ﴾ سورة النور، الآيتان: ٣٠- ٣١..

واتە : بڵێ بەباوەڕداران با چاویان بپارێزن وداوێنیان بپارێزن ئائەوا پاك ترە بۆ ئەوان ، خودا ئاگاداری ئەو کردەوانەیە کەدەیکەن ، وبە ئافرەتانی باوەڕدار بڵێ با چاویان بپارێزن وداوێنیان بپارێزن .

٣- وەمەبەست لە : ((وتحفظ البطن )) واتە : پاراستنی سك لەخواردنی حەرام ، وەك : ڕیبا ، وخواردنی ماڵی خەڵك بەناحەق ، وجگە لەمانەش کەخودا حەرامی کردووە ، هیچ شتێك ناخوات تەنها شتی حەڵاڵ نەبێت .

---

[١] الترمذي، كتاب البر، باب ما جاء في حسن الخلق، برقم ٢٠٠٤، وحسّن إسناده الألباني في صحيح الترمذي، ٢/ ٣٧٩.

وەمەبەست لە : ((**وما حوى** )) واتە : پاراستنی ئەوەی کەپەیوەندی بەسکەوە هەیە ونزیکە لێوەی ، وەك : داوێن ، پێیەکان ، ودەستەکان ، ودڵ .[٢]

٤- داوێنی دەپارێزێت لەو شتانەی کە خودا حەڕامی کردوون ، وەك : داوێن پیسی ، نێربازی ، ودەست پەڕ ، وجگە لەمانەش کەخودا حەڕامی کردووە .

٥- وەپێیەکانی دەپارێزێت و هەنگاو نانێت بۆ جێگایەك کەخودا حەڕامی کردبێت ، وهیچ کارێکیان پێناکات کەخودا حەڕامی کردبێت .

٦- وەدەستەکانی دەپارێزێت لەهەر شتێك کەخودا حەڕامی کردوون ، وهیچ شتێك بەدەستەکانی ئەنجام نادات کەخودا حەڕامی کردبێت .

٧- وەدڵی دەپارێزێت لە : حەسودی ، کین وبوغز ، خۆ بەزل زانی ، جا ئەم حەوت ئەندامەی لاشە شەرچاوەی نەهامەتییەکانن بۆ کەسێك کە لە بێفەرمانی خوادا بەکاریان بێنێت ، ولەهەمان کاتدا سەرچاوەی ڕزگار بوونە بۆ کەسێك کەلە گوێڕایەڵی خودادا بەکاریان بێنێت ، هەروەك ابن القيم رحمه الله باسی کردووە .

وە پێغەمبەری ئازیز صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی : (**(لا يدخل الجنة من كان في قلبه مثقال ذرة من كبر)**) [١] . واتە : ئەو کەسە ناچێتە بەهەشتەوە کە بەقەد مسقالە زەڕەیەك خۆ بەزل زانی لەدڵیدا هەبێت.

---

[٢] انظر: تحفة الأحوذي شرح سنن الترمذي، للمباركفوري، ٧/ ١٥٥.

[١] مسلم، برقم ٩١.

وەهەروەها پێغەمبەری ئازیز صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی : ((**ثلاث مهلكات** )) واتە : سێ شت لەناو بەرن ومرۆڤ بەهیلاکەت دەبەن ، پاشان فەرمووی : ((**فأما المهلكات: فشح مطاع، وهوى متبع، وإعجاب المرء بنفسه**)) [1].

واتە : بەنیسبەت لەنێو بەرەکانەوە : ڕەزیلیەك کە مرۆڤ بەگوێی نەفسی ڕەزیلی بکات ، وئارەزوویەك کەمرۆڤ شوێنی بکەوێت ، وسەرسام بوونی مرڤ بەنەفسی خۆی .

وەمەبەست :((**وتذكر الموت والبلى**)) واتە : بیر لەوە بکەیتەوە کەلەنێو گۆڕدا دەبیتە گڵ ودەڕزێیت .

وەمەبەست : ((**ومن أراد الآخرة ترك زينة الدنيا**))" بێگومان خۆش ویستنی دونیا ودوا ڕۆژ کۆ نابنەوە چونکە هەر کاتێك مرۆڤ یەکێکیانی خۆش ویست ئەوی تریان ئیهمال دەکات ، بۆیە نابێ مرۆڤی موسوڵمان زۆر گرنگی بەخۆشیەکانی دونیا بدات وهەموو هەم وغەمی لەپێناو دونیادا بێت .

وەمەبەست لە : ((**فمن فعل ذلك فقد استحيا من الله حق الحياء**)) واتە : هەموو ئەوانەی باس کران هەرکەسێك ئەنجامی بدات ئەوا بەڕاستی شەرمی کردووە لەخودا [2].

---

[1] المعجم الأوسط للطبراني ﴿مجمع البحرين في زوائد المعجمين، ١/ ١٥٦﴾، وحسنه الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة، ٤/ ٤١٦، برقم ١٨٠٢، ويأتي تخريجه في منكرات العيد آخر الكتاب.

[2] تحفة الأحوذي شرح سنن الترمذي للمباركفوري، ٧/ ١٥٥.

جا زۆربەی ڕۆژووەوانان وەك پێویست شەرم لەخودا ناکەن ، بەڵگەش بۆ ئەم قسەیە ئەو ئایەتە پیرۆزەیە : ﴿ وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ ﴾ (سورة سبأ، الآية: ١٣).

واتە : زۆر کەم لەبەندەکانم سوپاس گوزارن .

## سێیەم : ئیسراف و زێدەڕەوی و بەفیڕۆدانی ماڵ لەشتی بێ هوودەدا :

جا (ئیسراف) واتە : زێدەڕەوی کردن لەهەر کارێکا کەمرۆڤ ئەنجامی دەدات ، هەر چەند ئەمە زیاتر بۆ نەفەقە بەکار دێت . مفردات ألفاظ القرآن للأصبهاني، ص ٤٠٧.

وەبێگومان (ئیسراف) واتە : زێدەڕەوی کردن لەنەفەقەدا ، وبەفیڕۆدانی ماڵ لەشتێکدا کە سودی نەبێت ، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ وَالَّذِينَ إِذَا أَنفَقُوا لَمْ يُسْرِفُوا وَلَمْ يَقْتُرُوا وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا ﴾ (سورة الفرقان، الآية: ٦٧)

.واتە : موسوڵمانە ڕاستەقینەکان ئەوانەن کاتێ مەسرەف بکەن وماڵ ببەخشن ئیسراف ناکەن ، وڕەزیلیش ناکەن ولەو نێوەندەدان و وسەتن .

جا ئیسراف هەندێ جار لەئەندازەی شتەکاندا ڕوو دەدات ، وهەندێ جار لەچۆنیەتی شتەکاندا ڕوو دەدات " هەر بۆیە سوفیان دەیفەرموو : (( **ما أنفقت في غير طاعة الله فهو سرف** )) واتە : هەر شتێکت لەغەیری گوێڕایەڵی خوا سەرف کردبێت ئەوا ئیسرافە .

خوای پەروەردگاریش فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تُسْرِفُوا إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ ﴾ ( سورة الأنعام، الآية: ١٤١ .).

واتە : ئیسراف وزێدە ڕەوی مەکەن چونکە بەتەئکید خودا کەسانی زێدەڕەوی خۆش ناوێت .

بەڵام ( **التبذير** ) بریتی یە لە : جودا کردنەوە ، وئەسڵەکەی : فڕێدانی تۆوە ، وەهەروەها بەکار هاتووە بۆ هەر کەسێك کەماڵەکەی بەفیڕۆ بدات ، جا حەتمەن فڕێدانی (تۆو) ودانەوێڵە بۆ جێگایەك کەنەزانێت سەرەنجامەکەی چی یە و چۆن دەبێت ؟ زێدەڕەوییە ، خوای تەعالی فەرموویەتی :﴿ وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا ﴿٢٦﴾ إِنَّ ٱلْمُبَذِّرِينَ كَانُوٓا۟ إِخْوَٰنَ ٱلشَّيَٰطِينِ ۖ وَكَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ لِرَبِّهِۦ كَفُورًا ﴾ (سورة الإسراء، الآيات: ٢٦- ٢٨).

واتە: ماڵ بەفیڕۆ مەدە لەشتی بێ هودەدا ، بەدڵنیاییەوە ئەو کەسانەی کە ماڵ بەفیڕۆ دەدەن لەشتی بێ هودەدا هاوڕێ وهاوکاری شەیتانن ، وبێگومان شەیتانیش کافرە بەپەروەردگاری .

وبێگومان زۆر کەس ئیسراف وزێدەڕەوی دەکەن بەتایبەت لەخواردن وخواردنەوەدا ، وئەو خورادنەی لێیان بمێنێتەوە فڕێی دەدەنە نێو زبڵدانەکان و ڕێگاکانەوە ، وەحەتمەن ئەمەش کارێکی ناشەرعییە ، هەروەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ خُذُوا۟ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ وَلَا تُسْرِفُوٓا۟ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴾ ( سورة الأعراف، الآية: ٣١).

واتە : ئەی نەوەی ئادەم جلەکانتان لەبەر بکەن لەکاتی چوونە مزگەوتدا ، وئیسراف وزێدەڕەوی مەکەن ، چونکە خودا زێدەڕەوانی خۆش ناوێت .

وەئیمامی بوخاری فەرموودەیەکی بەموعەلەقی کەتەئکیدی لەسەحیحی کردۆتەوە هێناوە ودەڵێت پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی : **((كلوا ، واشربوا، والبسوا، وتصدقوا في غير إسرافٍ ولا مخيلة ))**[1].

واتە : بخۆن ، بخۆنەوە ، وجل بپۆشن ، ومالّ ببەخشن ، بەبێ ئەوەی ئیسراف بکەن وخۆتانی پێوە هەڵکێشن .

جا ئیسراف وزێدەڕەوی تەنانەت لەبەکار هێنانی ئاویشدا خراپە ومەزموومە ، هەر بۆیە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی : **((سيكون في هذه الأمة قوم يعتدون في الطهور والدعاء))**[2].

واتە : لەداهاتووەیەکی نزیکدا کۆمەڵێك لەم ئومەتەی من پەیدا دەبن زێدەڕەوی دەکەن لەبەکار هێنانی ئاو و پاڕانەوەدا .

جا هەموو ئەو بەڵگانەی ئاماژەمان پێدا بەڵگەن لەسەر حەڕامیەتی ئیسراف وزێدەڕەوی وسەرف کردن مالّ لەشتێکدا کە پێویست نەبێت وبەفیڕۆ دانی مالّ ، هەر بۆیە نابێ کەسی موسوڵمان یەکێك لەو کارانە بەئەنقەست ئەنجام بدات ، وبێگومان هەموان هەست بەزێدەڕەوی دەکەن لەمانگی ڕەمەزاندا وخەڵکێکی

---

(1) البخاري، كتاب اللباس، باب قول الله تعالى: ﴿ قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللهِ الَّتِيَ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ ﴾ قبل الحديث رقم ٥٧٨٣.

(2) أخرجه أبو داود، كتاب الطهارة، باب الإسراف في الماء، برقم ٩٦، وصححه الألباني في صحيح سنن أبي داود، ١/ ٢١، وفي إرواء الغليل، ١/ ١٧١.



زۆر خواردن وخواردنەوەیەکی بێ ئەندازە وجۆرەها میوە لەسەر سفرەکانیان دادەنێن وزۆربەی خەسار دەبێت وفڕێ دەدرێتە نێو زبڵدانەکانەوە .

هەربۆیە ئیسلام شێوازی خواردن وخواردنەوەی ڕێك خستووە ، هەروەك مەعدانی کوڕی یەکڕوب دەڵێ : گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو : **((ما ملأ آدميٌّ وِعَاءً شراً من بطنٍ، بحسب ابن آدم أُكلاتٌ يُقِمْنَ صُلْبَهُ، فإن كان لا محالةَ: فَثُلُثٌ لطعامه، وثلثٌ لشرابه، وثُلُثٌ لنَفَسِهِ))**[1].

واتە : مرۆڤ هیچ قاپێکی پڕ نەکردووە لەسکی خراپ تر ، ئەوەندە خواردن بەسە کە مرۆڤ پشتی پێ ڕاگیر بکات ، جا ئەگەر هەرحەزی لێ بوو زۆر بخوات با : سێ یەکی سکی بۆ خواردن تەرخان بکات ، وسێ یەکی سکی بۆ خواردنەوە تەرخان بکات ، وسێ یەکی سکی بۆ نەفەسی تەرخان بکات .

وە لەلایەکی ترەوە بێگومان زۆری خۆراك وزیاد لەپێویست زیانی خراپی هەیە بۆ دڵ و جەستە .

---

([1]) الترمذي، كتاب الزهد، باب ما جاء في كراهية كثرة الأكل، برقم ٢٣٨٠، وابن ماجه، كتاب الأطعمة، باب الاقتصاد في الأكل، وكراهية الشبع، برقم ٣٣٤٩، وصححه الألباني في صحيح الترمذي، ٢/ ٥٥٥،وفي صحيح ابن ماجه، ٣/ ١٣٧.

**چوارەم : تەکلیف کردنی کەس وکار بەوەی خواردن وخواردنەوەیەکی زۆر ئامادە بکەن** ، حەتمەن ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی پیاو خێزانەکەی وئەوانەی خواردن دروست دەکەن لەخێرێکی زۆر بێ بەش بکات " چونکە زۆربەی ئافرەتان لەدوای نیوڕۆوە دەست دەکەن بەدروست کردنی خواردن وخواردن ئامادەکردن تاوەکو بانگی مەغریب ، پاشان دوای خواردنی دەست دەکەن بەشوشتن وپاك کردنەوەی قاپ وقاجاغ تاوەکو درەنگانێکی شەو ، وڕەنگە ببێتە هۆی نەکردنی نوێژ لەکاتی خۆیدا ، پاشان دەس دەکەن بەخواردن ئامادە کردن بۆ پارشێو ، ئەمەش وا لەزۆربەی ماڵەکان دەکات بێبەش بن لەنوێژی تەراویح یاخود کەم تەرخەمی بکەن لەکردنی نوێژە فەرزەکان لەکاتی خۆیدا .

**پێنجەم : خەوتن لەکاتی پارشێو کردندا** ، بەشێوەیەك خۆی بێبەش دەکات لە باشترین شت لەو کاتە پیرۆزەدا کەئەویش داوای لێخۆش بوون کردنە ، خوای پەروەردگار فەرموویەتی:﴿ وَبِٱلۡأَسۡحَارِ هُمۡ يَسۡتَغۡفِرُونَ ﴾ (سورة الذاريات، الآية: ١٨).

واتە : موسوڵمانە ڕاستەقینەکان ئەوانەن کە لەپێش بەیانیان داوای لێخۆش بوون دەکەن .

وە طاوس بن کیسان الیماني دەڵێت : ((**ما كنت أظنُّ أحداً من أمّة محمد صلى الله عليه وسلم ينام وقت السحر**)).واتە : من باوەڕ ناکەم کەسێك لەئومەتی موحەمەد صلى الله عليه وسلم لەکاتی پاشێودا بنوێت .



وبێگومان پیاو چاکان خویان گرتبوو بەزیندوو کردنەوەی پاشێوەوە و داوای لێخۆش بوونیان دەکرد بۆ ئەوەی پاداشتیان دەس کەوێت ، وبچنە بەهەشتەوە ، وەهەروەها وەك جێ بەجێ کردنی سوننەت ، ولەپێش هەمووشیانەوە بۆ بەدەمەوە هاتنی فەرمانی خوا .

وبێگومان کاتێ خۆراکی ڕوح لەدەس دەچێت ئەوا لەو کاتەدا خۆراکی لاشەش لەدەس دەچێت " وەحەتمەن پارشێو کردن سوننەتە ، ئەویش خواردنی خواردنە لەکۆتایی شەودا پێش بانگی دووەمی بەیانی " هەربۆیە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو : ((**تسحَّروا فإن في السحور بركة** ))[1]، واتە: پاشێو بکەن " چونکە بەتەئکید لەپاشێو کردندا بەرەکەت هەیە .

وەهەروەها فەرموویەتی : ((**فصل ما بين صيامنا وصيام أهل الكتاب أكلة السَّحَر** ))[2].

واتە : جیاوازی نێوان ڕۆژوی ئێمە وئەهلی کتاب خواردنی پاشێوە وپاشێو کردنە وەئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پاشێو نەکردن خۆ شوبهاندنە بەئەهلی کتاب ، وبێگومان ئێمە فەرمانمان پێ کراوە بە موخالەفە کردنیان ، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی : ((**السحور كله بركة فلا تدعوه ولو أن يجرع أحدكم**

(1) متفق عليه: البخاري، برقم ١٩٢٣، ومسلم، برقم ١٠٩٥، وتقدم تخريجه في المبحث السادس عشر: مستحبات الصيام.

(2) مسلم، برقم ١٠٩٦، وتقدم تخريجه في المبحث السادس عشر: مستحبات الصيام.

**جرعة من ماء" فإن الله وملائكته يصلون علي المتسحرين))** [(١)].

واتە : پاشێو كردن هەمووی بەرەكەتە ، وازی لیێ مەهێنن ، هەرچەند قومێكی ئاویش بێت ، خودا وپێغەمبەرەكەی سەڵاوات دەدەن لەسەر ئەو كەسانەی پاشێو دەكەن .

ئایا دەنگونجیێ كەسی عاقڵ خۆی بێبەش بكات لەم فەزڵە گەورەیە كەسەڵاواتی خودا وفریشتەكانە ، لەگەڵ چەند سودێكی تر .

**شەشەم : نەكردنی نوێژی بەیانی** ، جا لەو كاتەدا بخەوێت ،یاخود پێش كاتەكەی بیكات ، ویاخود بەخەوە نوچكێوە نوێژ بكات ، ویاخود بەجوانی نەیكات ویاخود پیاوان نوێژ لەماڵەوە بكەن ونەچن بۆ مزگەوت ، جا ئەوەی بەم شێوازە بێت دەترسین تەنها لەرۆژووەكەیدا تینوێتی وبرسێتیەكەی بۆ بمێنێتەوە " چونكە بێوگمان نوێژی بەیانی یەكێكە لەگرنگترین نوێژەكان ، بەڵكو میزانی كەسی باوەڕدارە ، ونیشانەی چاكی وپابەندییەتی ، خوای پەروەردگار سوێندی بەنوێژی بەیانی خواردووە ولەگەڵ بەباشترین كاتدا ناوی هێناوە ، كەئەویش دەی مانگی(ذي الحجة)، وبە(الشفع والوتر) و(بالليل إذا يسرِ)، وەدەبێتە پارێزەر بۆ بەندە لەشەودا ، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی : **(( من صلى العشاء في جماعة فكأنما قام نصف الليل، ومن صلى الصبح في جماعة فكأنما**

---

([1]) أحمد في المسند، ٣/ ١٢، ٤٤،وحسنه الألباني لغيره في صحيح الترغيب والترهيب، ١/ ٦٢١، وتقدم تخريجه في المبحث السادس عشر: مستحبات الصيام.



**صلى الليل كله))**[١] .

واتە : هەر کەسێك نوێژی عیشا بەجەماعەت بکات ئەوا وەك ئەوە وایە تاوەکو نیوەی شەو شەو نوێژی کردبێت ، وەهەرکەسێك نوێژی بەیانی بەجەماعەت بکات ئەوا وەك ئەوە وایە هەموو شەوەکە شەو نوێژی کردبێت .

وەهەروەها دەبێتە پارێزەر بۆ بەندە لەڕۆژدا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی : ((**من صلى الصبح فهو في ذمة الله** ))[٢] .

واتە : هەرکەسێك نوێژی بەیانی بکات ئەوا لەپارێز بەندی خودادا دەبێت ودەیپارێزێت .

وەبێگومان فەزڵ وڕێزی نوێژی بەیانی لەئەژمار کردن نایەت ، هەرکەسێك ئەنجامی بدات ئەوا کەسێکی گەورەیە ، وبەهێزە ، ونورانیە ، وموبارەکە ، وزاڵ بووە بەسەر نەفسی خۆی وشەیتاندا ، وکاتەکانی پاراستووە ، ووکەڵکی لەژیانی وەرگرتووە ، وهەرکەسێك ئەنجامی نەدات ، ئەوا باشترین شتی ژیانی بەزایە چووە ، وبەرەکەتی کەم دەبێتەوە ، ونیشانەیەك لەنیشانەکانی مونافیقی تێدا هاتووەتە جێ ، هەر بۆیە پێویستە ئینسانی موسوڵمان هەوڵ بدات هەستێت بو نوێژی بەیانی ، وهەوڵەکانی بخاتە گڕ ، وئەو هۆکارانە بگرێتە بەر کەیارمەتی دەدەن .

---

(1) مسلم، كتاب المساجد، باب فضل صلاة العشاء والصبح، برقم ٦٥٦ .

(2) مسلم، كتاب المساجد، باب فضل صلاة العشاء والصبح، برقم ٦٥٧ .

**حەوتەم : زۆر خەوتن لەڕۆژدا** ، حەتمەن ئەم کارە پێچەوانەی سوننەتی خودایە " چونکە خودا شەوی تایبەت کردووە بەنوستنەوە وڕۆژیش بۆ هەوڵ وکۆشش ، وەبێگومان نوستن لەڕۆژدا دەبێتە هۆی لەدەست چوونی خێرێکی زۆر " چونە کار کردن لەکاتی بەڕۆژوو بووندا باشترە لەکاتەکانی تر لەبەر ڕێزی زەمانەکە ، ونوستن لەڕۆژدا دەبێتە هۆی بەفیڕۆدانی کات و تەمەن ، وەبەشێوەیەك لەشێوەکان نارەزای دەربڕینی تێدایە بەرانبەر عیبادەتەکان و نارەحەت بوون بە عیادەت کردن ، ودەبێتە هۆکاری ئەوەی وا پیشان بدرێت تەکلیفە شەرعیەکان نارەحەتیان تێدایە ، وەبانگەشە کردنی تێدایە بۆ تەمبەڵی ، وتۆمەت بار کردنی ئیسلامە بەوەی دینی تەمەبەڵی وتەوەزەلییە ، وەچەندین زیانی تر ، جا باشترین کات بۆ خەوتن لەڕەمەزاندا کاتی پێش نیوەڕۆیە کەپێی دەوترێت (قەیلولە) کە دەبێتە هۆی ئیسراحەت کردن ویارمەتی دەرە بۆشەو نوێژ کردن .

❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊



**هەشتەم : بەفیڕۆ دانی کات لەنێوان خەوتن ، وتی وتیدا** ، وەهەروەها زۆر پرسیار کردنی بێ هودە ، وگێڕانەوەی هەواڵێك کەهیچ قازانجێکی نەبێت ، وەهاوڕێیەتی کەسانی خراپ ، جا بێگومان کاتی باوەڕدار زۆر بەنرخە ولەڕەمەزاندا زیاتر بەنرخە ، لەبەر ڕێزی زمان و جێگاکەی .

..جا کات چەن تایبەتمەندیەکی هەیە ، لەوانە :

ئەوەی لەدەس چوو ناگەڕێتەوە ، وزوو تێپەڕ دەبێت ، وەهەروەها لەزێڕ وزیو بەنرخ ترە ، ونیعمەت ودەسکەوتە ، ولەبەر گەورەیی خودا سوێندی پێ خواردووە .

**نۆیەم : ئیهمال کردنی قورئانی پیرۆز** ، وبێ بەش بوون لەپاداشتەکەی ، جا چەندین شت هەیە کەوا دەکات بێ ئاگا بیت لەقورئان ، لەوانە :

زۆر نوستن ، وزۆر ئەنجامدانی شتی بێ هودە ، وگاڵتە زۆر کردن ، ومەشغوڵ بوون بەدونیاوە ، وهاوڕێیەتی کەسانی خراپ ، وتاریکی دڵ ، وزاڵ بوونی شەیتان ، وزۆر تاوان کردن ، وباوەڕ گزی .

بێگومان قورئان کەلامی خودایە گەر دایبەزاندایەتە سەرکێوەکان ئەوا لەت لەت دەبوون لەترسی ، وقورئان ئەو شتە کەخودا دڵەکانی پێ ڕێنوێنی دەکات ، وبەهۆیەوە لەتاوانەکان دەبورێت ، وعەیب وکەم وکورتییەکان دادەپۆشێت ، وبەهۆیەوە مرۆڤ پێویستیەکانی بەدەس دێنێت .

وەڕەمەزان مانگی قورئانە ، چونکە خودا لەڕەمەزاندا قورئانی دابەزاندووە ،

وجبريل عليه السلام موراجەعەی قورئانی بەپێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەکرد ، وسەلەف لەڕامەزاندا وازیان لەهەموو شتێك دەهێنا وڕویان دەکردە قورئان

**دەیەم : دوعا نەکردن لەکاتی ڕۆژوو شکاندندا** وبەگشتی لەکاتی بەڕۆژوو بووندا ، حەتمەن ئەمەش یەکێکە لەموخالەفاتەکان ، وبێگومان پاڕانەوە عیبادەتە ، ومرۆ بەپاڕانەوە بێدەسەڵاتی خۆی پیشانی خودا دەدات وپێویستیەکانی بەخودا دەڵێت ، وبەردەوام بەهۆی دوعاوە پەیوەندیەکی بتەوی لەگەڵ خودادا دەبێت ، جا خوای پەروەردگار لەچەند کاتێکدا زیاتر پاڕانەوە وەردەگرێت ، لەوانە :

پاڕانەوەی کەسێك کەبەڕۆژوو بێت ، هەروەك پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی : ((**ثلاثة لا ترد دعوتهم: الإمام العادل، والصائم حين يفطر، ودعوة المظلوم**))[1].

واتە : سێ کەس پاڕانەوەکانیان ڕەت ناکرێتەوە :

دەسەڵات دارێکی داد پەروەر ، وڕۆژووەوان لەکاتی ڕۆژوو شکاندندا ، وپاڕانەوەی کەسی ستەم لێراو .

وەپێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کاتێ ڕۆژووی دەشکاند دەپاڕایەوە ودەیفەرموو : ((**ذهب الظمأ وابتلت العروق، وثبت الأجر إن شاء الله**))[2].

---

([1]) الترمذي،برقم ٣٥٩٨،ورقم ٢٥٢٦،وابن ماجه،برقم ١٧٥٢،وأحمد،١٥/ ٤٦٣، برقم ٩٧٤٣، ورقم ٨٠٤٣، و ١٣/ ٤١٠، وصححه الألباني في صحيح ابن ماجه، ٢/ ٨٦، وتقدم تخريجه في فضائل الصوم.

([2]) أبو داود، كتاب الصوم، باب: القول عند الإفطار، برقم ٣٢٥٧، وحسنه الألباني في صحيح أبي داود، ٢/ ٥٩.

واتە : تینوێتی نەما و دەمارەکان ڕوانەوە ، وپاداشتەکەشمان جێگیر بوو گەر خودا ویستی لیٚ بیٚت .

## یانزەیەم : نەکردنی نوێژی مەغریب لەمزگەوت وخۆ خەریك کردن بەشکاندنی ڕۆژووەوە

**بەشکاندنی ڕۆژووەوە** بەیانووی ئەوەی کەلەم فەرموودەیەدا هاتووە :

((**إذا حضر العَشاء وأقيمت الصلاة فابدؤوا بالعَشاء** ))[١]، واتە : کاتیٚ خواردن ئامادە بوو ونوێژ دابەستر ئەوا خواردنەکە سەرەتا بخۆن .

وەهەروەها ئەم فەرموودەیەش : ((**لا صلاة بحضرة طعام ...**))[٢].

واتە : نوێژ ناکرێت کاتێك خواردن ئامادە بێت .

وەبێگومان پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم عادەتی وابوو ڕۆژووی دەشکاند بەچەند دەنکە خورمایەکی شل ، یاخود خورمای قەسپ ،ویاخود بەچەند گوێلێك ئاو ، پاشان نوێژی دەکرد و خواردن سەر قاڵی نەدەکرد لەنوێژکردن ، هەربۆیە پێویستە کەسی موسوڵمان شوێنی سوننەت بکەوێت لەشکاندنی ڕۆژوودا وبەچەند دەنکە خورمایەك ڕۆژووەکەی بشکێنێت ، پاشان نوێژە جەماعەتەکەی بکات و ڕۆژوو شکاندن نەبێتە ڕێگر لەبەردەم نوێژە جەماعەتەکانیدا .

(1) مسلم، كتاب المساجد، باب: كراهة الصلاة بحضرة طعام، برقم ٥٥٧.

(2) مسلم، كتاب المساجد، باب: كراهة الصلاة بحضرة الطعام الذي يريد أكله في الحال، وكراهة الصلاة معه مع مدافعة الحدث، برقم ٥٦٠

**دوانزەیەم : نەکردنی نوێژی تەراویح نەلەمزگەوت بەجەماعەت ونەلەماڵ بەتەنها** ، بێگومان کردنی بەجەماعەت باشترە لەوەی بەتەنها بیکات " چونکە لەسوننەتدا بەم شێوەیە هاتووە " پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم سێ شەو نوێژی بەهاوەڵان کرد ، ولەشەوی چوارەمدا نەچوو بۆی نەکردن لەترسی ئەوەی نەبادا فەرز ببێ لەسەریان وتوانای ئەنجام دانیان نەبێت ، وەئیمامی عومەر خەڵکی کۆ کردەوە بۆ ئەوەی لەدوای ئوبەی کوڕی کەعبەوە نوێژ بکەن ، ولەفەرموودەکەی ئەبو زەڕدا هاتووە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی : ((**إنه من قام مع الإمام حتي ينصرف كتب له قيام ليلة**))[1]،

واتە : هەرکەسێك لەگەڵ ئیمامدا دەست بکات بەنوێژ کردن تاوەکو ئیمام لێ دەبێتەوە ، ئەوا شەونوێژی شەوێکی بۆ دەنوسرێت .

ولەفەرموودەیەکی تردا هاتووە : ((**من قام رمضان إيماناً واحتساباً غُفِر له ما تقدم من ذنبه**))[2].

واتە : هەر کەسێك لەڕەمەزاندا تەڕاویح بکات وباوەڕی پێی هەبێت وچاوەڕێی پاداشت بێت ئەوا تاوانەکانی پێشوی دەسڕدرێتەوە .

وەخوای پەروەردگار وەسفی ئەو کەسانەی کردووە کە شەو نوێژ دەکەن وباس

---

(1) أحمد، ٥/ ١٥٩، والترمذي، برقم ٨٠٦، وأبو داود، برقم ١٦٠٥، والنسائي، برقم ١٦٠٥، وابن ماجه، برقم ١٣٢٧، وتقدم تخريجه في صلاة التراويح، وصححه الألباني في صحيح النسائي، ١/ ٣٥٣، وفي غيره.

(2) متفق عليه:البخاري،برقم ٩٩٠،ومسلم،برقم ٧٤٩،وتقدم تخريجه في فضائل رمضان.

لەوە دەكات كەیەكێك لەسیفاتی بەهەشتیەكان ئەوەیە شەوان كەم دەخەون وشەو نوێژ دەكەن ، هەروەك فەرموویەتی:﴿ ذُوقُواْ فِتۡنَتَكُمۡ هَٰذَا ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تَسۡتَعۡجِلُونَ ﴿١٤﴾ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٍ ﴿١٥﴾ ءَاخِذِينَ مَآ ءَاتَىٰهُمۡ رَبُّهُمۡۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَبۡلَ ذَٰلِكَ مُحۡسِنِينَ ﴿١٦﴾ كَانُواْ قَلِيلٗا مِّنَ ٱلَّيۡلِ مَا يَهۡجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَبِٱلۡأَسۡحَارِ هُمۡ يَسۡتَغۡفِرُونَ ﴾ (سورة الذاريات، الآيات: ١٥- ١٨).

واتە : كەسانی بەتەقوا وپارێزكار لەبەهەشتانێكدان كەكانیاوی تێدایە ، ئەو شتانەیان وەرگرتووە كەخودا پێی بەخشیون ، ئەوانە پێشتر كەسانێكی چاكە كار بوون ، وبەشەوان كەم دەخەوتن ، ولەبەرە بەیاندا داوای لێخۆش بوونیان دەكرد.

وەبێگومان بەنەكردنی شەو نوێژ خێرێكی گەورە لەدەس مرۆڤ دەچێت ، وە وا لەمرۆڤ دەكات بێئاگا بێت وشەیتان زاڵ ببێ بەسەریدا ، بۆیە كەسی عاقڵ وژیر ئەو دەسكەوتە لەدەست نادات ئاگاداری ئەو پاداشتە گەورەیە دەبێت ، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی : ((**عليكم بقيام الليل" فإنه دأب الصالحين قبلكم، وإن قيام الليل قربة إلى الله، ومنهاةٌ عن الإثم، وتكفير للسيئات، ومطردة للداء عن الجسد**))[1]. واتە : ئاگاداری شەو نوێژ كردن بن ودەستی پێوە بگرن ، بێگومان شەونوێژ عادەتی پیاو چاكانە ، وشەو نوێژ هۆكاری نزیك بوونەوەیە لەخودا ، وڕێگریدەكات لەتوش بوون بەتاوان ، ودەبێتە

---

(1) الترمذي، كتاب الدعوات، باب من فتح له منكم باب الدعاء، برقم ٣٥٤٩، والحاكم، ١/ ٣٠٨، والبيهقي، ٢/ ٥٠٢، واللفظ للترمذي، وحسنه الألباني في إرواء الغليل، ٢/ ١٩٩، وفي صحيح الترمذي، ٣/ ٤٦٠.

هۆی سڕینەوەی گوناه ، ونەخۆشی ودەرد لەلاشە دوور دەخاتەوە .

**سیانزەیەم: شەو درەنگ خەوتن ،** جا چ هەموو شەوەکە بەخەبەر بێت یاخود زۆربەی شەوەکە بەخەبەر بێت ونەنوێت ، جا بێگومان درەنگ خەوتن نەخۆشیەکی کوشندەیە ودڵ خاپور دەکات ، وخێرێکی زۆر بەهۆیەوە لەدەس دەچێت ، ودەبێتە هۆی چەندین تاوان ، وە وا لەمرۆڤ دەکات کردەوەی چاکەی خۆش نەوێت ، ودەبێتە هۆکار بۆ چەندین تاوان ، وزیان ، هەندێك لەوانە :

١- پێچەوانەی سوننەتی خوای گەورەیە " چونکە خودا شەوی اداناوە ئیسراحەتی تیادا بکرێت وڕۆژیش کەسابەت تیادا بکرێت ، هەر بۆیە شەو تاریکە وجێگای دانیشتنە ، وڕۆژی ڕوناکە وجێگای جوڵانە .

٢- پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرە صلى الله عليه وسلم " چونکە پێی خۆش نەبووە مرۆڤ پێش عیشا بخەوێت ، ولەدوای عیشاوە قسە بکات ونەخەوێت[1]، جا مەبەست لەقسە ئەو قسانەیە کەدروستن ، بەڵام بەنیسبەت قسەی حەرامەوە ئەوا لەهەموو کاتێکدا حەرامە ، وەپێغەمبەر صلى الله عليه وسلم سەرەتای شەو دەخەوت ودوای نیوەی شەو هەڵدەستا تا کۆتایی شەو و ١١یاخود ١٣ ڕەکات نوێژی دەکرد .

٣- زیان گەیاندنە بەنەفس " چونکە خەوتن مافی نەفسە ، وحەتمەن بێبەش

---

([1]) متفق عليه: البخاري، كتاب مواقيت الصلاة، باب وقت العصر، برقم ٥٤٧، ومسلم، كتاب المساجد، باب استحباب التبكير بالصبح، برقم ٦٤٧.

کردنی نەفس لەخەو زیان گەیاندنە پێی ، گومانیش لەوەدا نی یە کەزیان گەیاندن حەڕامە ، خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ وَلَا تُلْقُوا۟ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ ﴾( سورة البقرة، الآية: ١٩٥).واتە : بەدەستی خۆتان مەخەنەوە تەنگانەوە .

وە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: ((**وإن لنفسك عليك حقاً**))[1]، واتە : نەفست مافی بەسەرتەوە هەیە .

وەهەروەها فەرموویەتی : ((**لكني أصوم وأفطر، وأصلي وأرقد، وأتزوج النساء، فمن رغب عن سنتي فليس مني**))[2].

واتە : من ڕۆژوووش دەگرم ، وهەندێ جار بەڕۆژوو نابم ، وشەو نوێژ دەکەم و دەش خەوم ، وژن دێنم ، جا هەرکەسێك شوێی سوننەتی من نەکەوێت ئەوا لەسەر ڕێبازی من نی یە ومن لێی بەریم .

٤- زیان گەیاندن بەکەسانی تر ، چونکە کەسانی تر ئیزعاج دەکات بەدەنگ وهاوار کردنی ، وبەیاری کردن وگاڵتە و گەپی ، وبێگومان زیان گەیاندن بەموسوڵمان حەڕامە ، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَـٰتِ بِغَيْرِ مَا ٱكْتَسَبُوا۟ فَقَدِ ٱحْتَمَلُوا۟ بُهْتَـٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴾ ( سورة الأحزاب، الآية: ٥٨.) واتە : ئەوانەی کە ئەزیەتی پیاو وئافرەتانی باوەڕدار

---

(1) متفق عليه:البخاري،برقم ٩٧٥،ومسلم،برقم ١١٥٩،ويأتي تخريجه في صيام التطوع.

(2) البخاري، كتاب النكاح، باب: الترغيب في النكاح، برقم ٥٠٦٣، مسلم، كتاب النكاح، باب استحباب النكاح، برقم ١٤٠١

دەدەن بەبێ ئەوەی شتێکیان کردبێت شیاوی ئەزیەت دان بێت ، ئەوانە توشی بوهتان وتاوانێکی ڕوون وئاشکرا بوونە .

وە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: ((**المسلم من سلم المسلمون من لسانه ويده، والمؤمن من أَمِنَــهُ الناس على دمائهم وأموالهم** ))[1].

واتە : موسوڵمان ئەو کەسەیە کەموسوڵمانان لەدەست وزمانی پارێزراو وئەمین بن ، و وەڕدار ئەو کەسەیە کەباوڕداران خەڵك لێی ئەمینن لەوەی دەست بۆماڵیان بەرێت وخوێنیان بڕێژێت .

ولەلەفزێکی تردا هاتووە کەئیمامی بوخاری گێڕاویەتیەوە لە عبد الله ی کوڕی عومەرەوە : ((**المسلم من سلم المسلمون من لسانه ويده، والمهاجر من هجر ما نهى الله عنه** ))[2].

واتە : موسوڵمان ئەو کەسەیە کەموسوڵمانان لەدەست وزمانی پارێزراو وئەمین بن ، وموهاجیر ئەو کەسەیە کە ئەو شتانەی هەجر کردووە کەخودا ڕێگری لێ کردووە .

**٥- لەدەس چوونی شەو نوێژ ، حەتمەن هەرکەسێك شەو نوێژی لەدەس بچێت**

---

([1]) الترمذي، كتاب الإيمان، باب ما جاء في أن المسلم من سلم المسلمون من لسانه ويده، برقم ٢٦٢٧، والنسائي، كتاب الإيمان، باب صفة المؤمن، برقم ٤٩٩٨، وقال الألباني في صحيح الترمذي، ٣/ ٤٧: ((حسن صحيح)).

([2]) متفق عليه: البخاري، كتاب الإيمان، برقم ١٠، ومسلم كتاب الإيمان، باب جامع أوصاف الإسلام، برقم ٤٠.

ئەوا بێبەش بووە لەخێرێکی زۆر ، وسەلەف وایان دەبینی کە هۆکاری نەکردنی شەو نوێژ تاوان بێت و ببێتە ڕێگر لەبەردەمیدا .

٦- بێبەشبوونی لە لێخۆشبوونی تاوان ، و بێبەش بوونی لەوەی پاڕانەوەکانی وەڵام بدرێتەوە ، وئەو شتانەی کەداوای دەکات خودا پێی نەبەخشێت ، ئەبو هورەیرە گێڕاویەتیەوەو دەڵێت : پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی:((**ينزل ربنا تبارك وتعالى كل ليلة إلى السماء الدنيا حين يبقي ثلث الليل الآخر فيقول: مَن يدعوني فأستجيبَ له،مَن يسألني فأعطيَه،مَن يستغفرني فأغفرَ له** ))(١).

واتە : خوای پەروەردگار هەمووشەوێك دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا کاتی سێیەکی کۆتایی شەو دەمێنێت ، بانگ دەکات ودەفەرموێت : کێ هەیە داوام لێ بکات ومن وەڵامی بدەمەوە ؟ کێ هەیە داوامان لێ بکات ومن پێی ببەخشم ؟، وکێ داوای لێ بوردن لێ دەکات ومن لێی ببورم ؟.

٧- لەدەس چوونی نوێژی بەیانی ، بێگومانی نوێژی بەیانی نیشانەی باوەڕدارانە ، وقورسە لەسەر دووڕووەکان ، وئیعلان کردنی جەنگە لەگەڵ شەیتان ، فەزڵ وڕێزەکانی ناژمرێدرێت لەبەر زۆری ، وزیانی درەنگ خەوتن زۆر زۆرە وهەندێکی کەمی لێرەدا ئاماژەی پێدراوە(٢).

---

(1) البخاري، كتاب الدعوات، باب الدعاء نصف الليل، برقم ٦٣٢١، ورقم ١١٤٥، ومسلم، كتاب صلاة المسافرين، باب الترغيب في الدعاء والذكر في آخر الليل والإجابة فيه، برقم ٧٥٨.

(2) انظر:تذكير الأنام بدروس الصيام،للشيخ سعد الحجري،ص ٧٠- ٧٩ .

## چواردەیەم : بە پەلە ئە نجام دانی نوێژی تەڕاویح :

لەو هەڵە دیارانەی کەهەندێ لەنوێژ خوێنان توشی دەبن ، وبەتایبەت هەندێ لەو کەسانەی کە پێش نوێژی بۆ خەڵك دەکەن ئەویش بەپەلە ئەنجام دانی نوێژی تەڕاویحە ، وهەندێ کەس لەگەڵ پەل کردن لەنوێژی تەڕاویح دا ڕاهاتوە ، ئەو پەلە کردنەی کە زیان بەنوێژ دەگەیەنێت وڕوکنەکانی وەك پێویست جێ بەجێ ناکرێت ، وەك ڕاوەستان تاوەکو لەحەرە کەوتنی لاشە لەکاتی چوونە ڕکوع وبەرزبوونەوە لێی وەهەرەها لەکاتی چوونە سەژدە ودانیشتن لەنێوان سەژدەکاندا ، وهەروەها حەرفەکانی قورئان دەمج دەکەن ، حەتمەن هەموو ئەمانە کاری خراپن " چونکە یان بۆ خۆ قوتار کردنە لەنوێژی تەڕاویح ، یاخود بۆ ڕیا ئەو کارە دەکات ودەبێتە هۆی ڕاکێشانی کەسانی جاهل ونەزان بۆ لای خۆی ، ئەوانەی کەحەز دەکەن لەچەند دەقەیەکدا نوێژەکەیان تەواو بکەن ، وحەتمەن ئەمەش فێڵێکە لەفێڵەکانی شەیتان لەباوەڕدارانی دەکات بۆ ئەوەی کارەکانیان بەتاڵ بێتەوە ، جا ئەو کەسانەی بەو شێوازە نوێژ دەکەن نوێژ کردنەکەیان زیاتر وەك گاڵتە کردنێکە بەوعیبادەتە نەك وەك بەندایەتی خودا پەرستی ، هەر بۆیە پێویستە موسوڵمان کاتێ چووە نوێژەوە بەم شێوازە کار دیارەکانی نوێژ ئەنجام بدات : قورئان بخوێنێت ، وبەپێوە بوەستێت ، وڕکوع بەرێت ، وسەژدە بەرێت .

وەبەنیسبەت ئەو کارانەی نوێژ کەپەیوەندی بەدڵەوە هەیە ، پێویستە بە ملکەچی ، وئامادەبوونی دڵ ، ودڵسۆزی ئیخلاس ، وبیر کردنەوە وتێفکرین



لەمانای کەلیماتەکانی قورئان نوێژەکەی ئەنجام بدات[١].

وەزۆربەی ئەو کەسانەی پێش نوێژی دەکەن لەزۆربەی وڵاتان ، نوێژێکی بێ سەر وبەر دەکەن ونازانن دەڵێن چی و ئاگایان لەنوێژەکانیان نی یە ، وەبێگومان ئامادە بوونی دڵ لەنوێژدا پێویست وگرنگە و هەروەها بیر کردنەوە لەمانای قورئان ،بەڵام کاتێك دوو بەرەکی دروست بوو لەنێوان پێش نوێژ و نوێژ خوێناندا ،وهەندێك پێیان خۆش بوو نوێژەکە زوو ئەنجام بدەن و هاو ڕا نەبوون لەگەڵ ئیمامدا لەکردنی نوێژ بەپێی سوننەت ، ئەوا پێویستە لەسەر ئیمامەکە نوێژەکەی بەشێوەیەك کورت نەکاتەوە کەلەکاتی چوونە ڕکوع وسەژدەدا گیانی لەحەڕەکە نەکەوێت ، بەڵکو با قورئان کەم بخوێنێت وخشوعی هەبێت لەکاتی چوونە سەژدە وڕکوع دا ، وەهەروەها بەهەمان شێوە کردنی ١٠ڕکات لەگەڵ ویتردا باشترە لەوەی ٢٠ڕەکات بەپەلە بکات " چونکە ناوەڕۆك وکرۆکی نوێژ ئامادەبوونی دڵە وڕوو کردنە خودایە ، وەزۆر جار خێرێکی کەم لەهی زۆر باشترە[٢].

## وَآخِرُ دَعْوَانَا أَنِ الْحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ

---

(1) انظر: إصلاح المساجد، للعلامة محمد جمال الدين القاسمي، ص ٨٥– ٨٦.

(2) انظر:الدرر السنية،٤/ ١٧٦– ١٨٧،من كلام الشيخ عبد الله بن محمد بن عبد الوهاب رحمه الله.

وانظر مخالفات لم تذكر في هذا البحث كتاب: مخالفات رمضان، للدكتور عبد العزيز بن محمد السدحان، فقد ذكر **مخالفات** كثيرة جزاه الله خيراً.